سەردەمی گوڵین - ٨

حەزرەتی

# فاتیمە

ڕەزای خوای لێبێت

د. عومەر یلماز






سەردەمی گوڵین

٨

حەزرەتی فاتیمە

(ڕەزای خوای لێبێت)

نووسینی: د. عومەر یڵماز
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: ئازار – ٢٠١٦
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی
(١٣١)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık – İstanbul – TURKEY
+90 212 886 83 30
www. nesematbaacilik. com

# ناوەرۆک

# حەزرەتی فاتیمە

سالی شەش سەد و شەشی زاینی بوو. خۆر بە هێمنی بەسەر لوتکەی چیای حیراوە هەڵدەهات، سڵاوی لە پێغەمبەری خوا دەکرد (دروودی خوای لێبێت) و خەڵکی مەککەی بەخەبەر دەهێنایەوە. لە ڕۆژێکی نوێدا کە تەواو ماندووی دەستی جەنگی درێژخایەنی نێوان هۆزەکان بوون، دەبووە بینەری دووبارە بنیاتنانەوەی کەعبەی پیرۆز. کەعبەی پیرۆز چین لەسەر چین هەڵدەچنرا و بنیات دەنرا، بەڵام کاتی دانانەوەی بەردەڕەشەکە لە شوێنی خۆیدا، ناکۆکی و لێکتێنەگەیشتن کەوتە نێوان هۆزەکانەوە. هەر هۆزە و ئەرکی دانانی بەردەڕەشەکەی بە مافی خۆی دەزانی، بۆیە هێندەی نەمابوو لەنێوانیاندا جەنگ بەرپا ببێت. دروستبوونی ئەو ناکۆکییەی نێوانیان لە گرنگیی بەردەڕەشەکەوە سەرچاوەی دەگرت، چونکە

ئەو بەردەڕەشە جوبرەئیل لەکاتی بنیاتنانی کەعبەدا بۆ حەزرەتی ئیبراهیمی هێنابوو.

ئەبو ئومەییەی سەرکردەی قورەیش هاتە دەنگ و بە مەککەییەکانی وت:

"ئەی خەڵکی قورەیش! یەکێك بکەنە داوەر لەنێو خۆتاندا با کۆتایی بەم ناکۆکییە بهێنێت. من بیرۆکەیەکم هەیە بۆتان، بێگومان پاش کەمێکی تر کەسێك دێتە ژوورەوە، یەکەم کەس کە هاتە ژوورەوە بیکەنە داوەر لەنێوتاندا و چی وت بەقسەی بکەن."

بیرۆکەکەی ئەبو ئومەییە جێی پەسەند بوو، هەربۆیە بڕیاریاندا یەکەم کەس کە هاتە ژوورەوە بیکەنە داوەر و هەرچی بڵێت بەگوێی بکەن. ڕۆژی دووشەممە بوو ئامادەبووان هەموو چاویان بڕیبووە دەرگاکە و چاوەڕێی کەسێکیان دەکرد کە بێتە ژوورەوە. لەکۆتاییدا کەسێك هات و ئەو کەسەش پێغەمبەری ئازیزمان بوو (دروودی خوای لێبێت) کە نازناوی محەممەدی ڕاستگۆیان لێ نابوو.

ئەو جێی متمانەی هەموان بوو. بۆیە مەککەییەکان تێکڕا وتیان "ئەوە محەممەدی ڕاستگۆ هات، ئێمە ڕازین بەهەر بڕیارێك ئەو بیدات."

پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) لەپێشدا گوێی لێ گرتن و لەپاشان عەباکەی سەرشانی داگرت و ڕایخست، بەردە ڕەشەکەی هەڵگرت و خستییە سەر عەباکە.

پاشان، به قورەیشییەکانی فەرموو "با سەرکردەی هەر هۆزێك لە لایەکەوە عەباکە بگرێت و بەرزی بکاتەوە."

هەموو بە دڵخۆشییەوە فەرمانەکەیان جێبەجێکرد چونکە بەم شێوەیە هەموو هۆزەکان بەشداربوون لە دانانەوەی بەردەڕەشەکە، لەپاشان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بەردەکەی هەڵگرت و خستییەوە شوێنی خۆی، بەم جۆرەش بەخۆشی کۆتایی بە ناکۆکییەکەی نێوانیان هێنا.

لە ساڵی نۆژەنکردنەوەی کەعبەی پیرۆزدا پێغەمبەری نازیزمان (درودی خوای لێبێت) کچێکی بوو و ناوی لێنا فاتیمە. لەپێش فاتیمەش پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) کچی تری هەبوو بەڵام جێی حەزرەتی فاتیمە جیاواز بوو.

حەزرەتی فاتیمە لە تەمەنێکی کەمدا دایکی نازیزی کە حەزرەتی خەدیجە بوو کۆچی دوایی کردبوو، هەربۆیە بە بێ نازی

دایک گەورە بووبوو. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) زۆری خۆشدەویست، نەدەزانرا هەروەک پێغەمبەر بە بێنازی دایک گەورەبوونی بوو، یاخود زۆر لە پێغەمبەری خوا چوونی بوو کە هێندە ئەوی لە باوکییەوە نزیک کردبوویەوە؟ بەڵام بەجۆرێک تەختی لە دڵی پێغەمبەری خوادا دانابوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) بەردەوام دەربارەی حەزرەتی فاتیمە دەیفەرموو "فاتیمە پارچەیەکە لە من."

نازناوی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) "دایکی باوکی خۆی" بوو هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە کاتێک باپیری پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) کۆچی دوایی کرد، ئەبو تالیبی مامی و فاتیمەی خێزانی هەر لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە ئەرکی بەخێوکردنی پێغەمبەری خوایان گرتبووە ئەستۆ (دروودی خوای لێبێت) فاتیمەی خێزانی مامی پێغەمبەر چاکەی زۆری بەسەر پێغەمبەری خواوە هەبوو، بەجۆرێک گرنگی بە پێغەمبەری خوا دەدا کە لەپێش منداڵەکانی خۆی نانی دەدایە و دەیگۆڕی. هەربۆیە پێغەمبەری ئێمەش (دروودی خوای لێبێت) نموونەی وەفا بوو، چاکەی دایە فاتیمەی لەیاد نەچووبوو و لە خۆشیی ئەو ناوی کچەکەی نا فاتیمە و نازناوی "دایکی باوکی خۆی"ی پێ بەخشی. دەکرێت ناوی فاتیمە لە ناوی داپیرەی پێغەمبەریشەوە هاتبێت کە ئەویش ناوی فاتیمە بوو،

هەروەها دایکی حەزرەتی خەدیجەش (ڕەزای خوای لێبێت) بە هەمان شێوە ناوی فاتیمە بوو.

فاتیمە بە مانای دوورخستنەوە دێت، نازناوی "فاتیمەی زەهرا"ش بە مانای ئەوە دێت کە خاوەنی ڕوخسارێکی جوانی مانگئاسا بووە و، لەناو منداڵەکانی پێغەمبەری خوادا حەزرەتی فاتیمە زیاد لە منداڵەکانی تر لە پێغەمبەری خوا چووە، هەندێک جاریش بە فاتیمەی بەتول ناودەبرا کە بەواتای "پاکیزە" دێت. ئەم دوو نازناوەش تەواو شایەنی حەزرەتی فاتیمە بوون (ڕەزای خوای لێبێت) چونکە هەم خاوەن ڕوخسارێکی جوان بوو، هەم زۆر بەئاکار و ڕەوشت بەرز بوو.

# نوێژکردن لە

# کەعبەی پیرۆزدا

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لەناو کەعبەی پیرۆزدا نوێژی دەکرد و بێباوەڕانیش لە دەوری بوون. ڕۆژی پێشوو وشترێکیان لەوناوە سەربڕیبوو.

ئەبو جەهلی سەردەستەی بێباوەڕان بەوانەی چواردەوری وت "کەس هەیە ڕیخۆڵەی ئەو وشترە بخاتە سەر شانی محەممەد کاتێك کە ڕۆشتە سوژدەوە؟"

عوقبە کە گوێی لەم داواکارییە بوو ڕیخۆڵەکەی هەڵگرت و خستییە سەر پشتی پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت)، ئەبو جەهل و هاوڕێکانیشی دایانە قاقای پێکەنین و لەتاو پێکەنین خەریك بوو دەکەوتن بەسەر یەکدا. کاتێك حەزرەتی فاتیمە ئەم دیمەنەی بینی خێرا ڕۆشت و ڕیخۆڵەکەی لەسەر پشتی باوکی لادا. زۆر دڵگران دەبوو بەم کارە چەوتانەی بەرامبەر باوکی خۆشەویستی دەکرا.

پێغەمبەری ئازیزیشمان کە لە نوێژەکەی بوویەوە دڵی دایەوە و پێی وت:

- خەم مەخۆ کچەکەم! خوای گەورە باوکت سەردەخات.

پاشان دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و دەستی کرد بە نزاکردن و فەرمووی "خوایە گیان ئەم کۆمەڵە قورەیشییە حەواڵەی تۆ دەکەم، خوایە گیان ئەبو جەهل و عوتبە و شەیبە و وەلید و عوقبە حەواڵەی لای تۆ دەکەم."

ئەو ناوانە لە سەرکردەکانی بێباوەڕان بوون، کاتێك گوێیان لە نزاکەی سەروەرمان بوو (دروودی خوای لێبێت)، ترس دایگرتن و لە پێکەنین کەوتن. چونکە ئەوانیش باوەڕیان بە گیرابوونی ئەو نزایانە هەبوو کە لە کەعبەی پیرۆزدا دەکران. پاش ماوەیەکی کەم ئەوەی لێی دەترسان یەخەی گرتن و هەموویان لە جەنگی بەدردا لەناوچوون.

## یەکەم ئاموژگاری بو

## حەزرەتی فاتیمە

سەرەتای ڕۆژەکانی پێغەمبەرێتی سەرومەرمان بوو (درودی خوای لێبێت) کە بە هەوڵێکی لە توانای مرۆڤ بەدەرەوە هەوڵی ناساندنی خوای تاك و تەنهای دەدا بە خەڵکی. حەزرەتی فاتیمەی دایکیشمان (ڕەزای خوای لێبێت) کە هێشتا منداڵ بوو بەردەوام لەگەڵ سەرومەرمان بوو و لێی جیانەدەبوویەوە. ڕۆژێك فەرمان بە سەرومەرمان کرا کە بانگەوازی خزمەکانی خۆی بکات بۆ ئایینی ئیسلام.

پێغەمبەری خواش یەکسەر هەستا، خەڵکی بانگکردوو پێی فەرموون ”ئەی خەڵکی قورەیش خۆتان لە سزای خوای گەورە بپارێزن، ئەگەرنا من هیچم لەدەستنایەت و ناتوانم بتانپارێزم.“

لەپاشان ڕووی کردە حەزرەتی فاتیمەی جگەرگۆشەی و پێی فەرموو ”کچی خۆم خۆت بپارێزە لە ئاگری دۆزەخ،

ئەگەر فەرمانەکانی خوای گەورە جێبەجێ نەکەیت من هیچم لەدەستنایەت و ناتوانم پارێزگاریت لێبکەم."

# تووڕەیی بێباوەڕەکانی مەککە

ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) تا لە ژیاندا بوو بەردەوام پشتیوانی پێغەمبەری خوا بوو، بەڵام لەپاش کۆچی دوایی ئەبو تالیب، بێباوەڕان بە دوای هەلێکدا دەگەڕان تا ئازاری پێغەمبەری خوا بدەن (دروودی خوای لێبێت). تەنانەت جارێکیان خۆڵیان کرد بە سەری پیرۆزیدا. کاتێك گەڕایەوە ماڵەوە حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لەلایەك بۆ باوکی دەگریا و لەلایەك خۆڵی سەر سەری پێغەمبەری ئازیزی دەتەکاند و خاوێنی دەکردەوە.

پێغەمبەری ئازداریشمان بەمجۆرە دڵی دەدایەوە "مەگری کچی شیرینم! دڵنیابە خوای گەورە لە شەڕی بێباوەڕان دەمپارێزێت. تا ئەبو تالیبی مامم لە ژیاندا بوو کەس نەیدەوێرا بەمشێوەیە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکات."

# مه‌ردایه‌تیی

# ئه‌بو سوفیان

له‌ سالآنی سه‌ره‌تای پێغه‌مبه‌رایه‌تیدا نه‌ك هه‌ر پێغه‌مبه‌ری نازیزمان (دروودی خوای لێبێت) به‌ڵکو خزمانی پێغه‌مبه‌ری خواش به‌ر شالآوی سزا و ئه‌شکه‌نجه‌ی بێباوه‌ڕان ده‌که‌وتن. ته‌نانه‌ت منداڵه‌کانی پێغه‌مبه‌ری خواش (دروودی خوای لێبێت) زۆرجار ڕووبه‌ڕووی هه‌ڵسوکه‌وتی ناشیرین ده‌بوونه‌وه‌. جارێکیان حه‌زره‌تی فاتیمه‌ (ڕه‌زای خوای لێبێت) له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی هێشتا منداڵ بوو ڕووبه‌ڕووی قسه‌ی ڕه‌قی ئه‌بوجه‌هل بوویه‌وه‌. به‌ڵام ئه‌بو سوفیان له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی هێشتا موسڵمان نه‌بووبوو، به‌رامبه‌ر ئه‌بوجه‌هل وه‌ستایه‌وه‌ و له‌سه‌ر حه‌زره‌تی فاتیمه‌ی کرده‌وه‌. ئه‌م هه‌ڵسوکه‌وته‌ی

ئەبو سوفیان زۆر کاری لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) کرد و پێغەمبەری خواش ستایشی کرد. قسەی پێغەمبەری خو لە دەرگانەی خوای گەورەدا زۆر بە بەهایە، ئەوە بوو ئەبو سوفیان لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا شادبوو بە ئایینی ئیسلام و موسڵمان بوو.

# هیجرەتی حەزرەتی
# فاتیمەی دایکمان

حەزرەتی فاتیمە تەمەنی گەشتبووە نزیك هەژدە ساڵ کە پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەڵام هێشتا جگەرگۆشەکەی (حەزرەتی فاتیمەی دایکمان) لە مەککە بوو.

پاش تەواوبوونی کاری بنیاتنانی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) پێنج سەد درهەمی زیو و دوو وشتری دا بە حەزرەتی زەیدی کوڕی حارس و هاوەڵێکی دی بە ناوی ڕافیع، ئەرکی ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە هێنانی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان و ئەندامەکانی تری خێزانی پێغەمبەری خوا بوو بۆ مەدینە،

حەزرەتی زەیدی کوڕی حارس و حەزرەتی ڕافیع بە جوانترین شێوە ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ کرد، حەزرەتی فاتیمەی دایکمان بە هاوکاری ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە توانی بێ هیچ ناڕەحەتییەك کۆچ بکات بۆ مەدینە.

لەو کاتانەدا پێغەمبەری نازدارێشمان (دروودی خوای لێبێت) لە مەدینە لە ماڵی ئەبو ئەییوبی ئەنصاریدا دەمایەوە.

# سۆز و خۆشەویستیی نیوان باوک و کیچ

هەرکاتێك پرسیار لە پێغەمبەری خوا بکرایە (دروودی خوای لێبێت) "ئایا لەناو خێزانەکەی خۆتدا کێت لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت؟"

بەردەوام دەیفەرموو "فاتیمەم لەناو خێزانەکەمدا لە هەموو کەس زیاتر خۆشدەوێت." هەرکاتێك حەزرەتی فاتیمەی دایکمان بهاتایەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لەبەری هەڵدەستا و بەخێرهاتنی دەکرد و لە جێگەکەی خۆیدا دایدەنیشاند. بە هەمان شێوە هەرکاتێك پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) بڕۆشتایەتە لای حەزرەتی فاتیمەی دایکمان، لەبەری هەڵدەستایەوە و دەستی ماچدەکرد و لە جێگەکەی خۆیدا دایدەنیشاند.

پێغەمبەری نازیزمان (دروودی خوای لێبێت) هەرکاتێك لە سەفەر بگەڕایەتەوە لەپێشدا لە مزگەوتەکەی خۆی دوو ڕکات نوێژی دەکرد و پاشان ڕاستەوخۆ دەڕۆشتە لای حەزرەتی فاتیمەی دایکمان.

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) سەردانی حەزرەتی عەلی و دایکی موسڵمانان حەزرەتی فاتیمەی کرد، حەزرەتی عەلی و فاتیمە لەنێوان خۆیاندا قسەیان دەکرد و پێدەکەنین، بەڵام کاتێك پێغەمبەری خوایان بینی بێدەنگ بوون.

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) لێی پرسین:

– بۆچی پێدەکەنین و کە منتان بینی بێدەنگ بوون؟

فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) وەڵامیدایەوە و فەرمووی:

– بابە گیان عەلی دەڵێت "پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) منی لە تۆ زیاتر خۆشدەوێت"، منیش دەڵێم "نەخێر، پێغەمبەری خوا منی زیاتر خۆشدەوێت."

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بە وەڵامەکەی حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) زەردەخەنە گرتی، خۆشویستنی حەزرەتی فاتیمە لە هەموو کەس زیاتر لەلایەن پێغەمبەری خواوە، شتێکی سروشتی بوو، بەڵام حەزرەتی عەلیش

خاوەنی شوێنێکی جیاواز بوو لە دڵی پێغەمبەردا (درودی خوای لێبێت). ئەو چەندین جار لە مەیدانی جەنگدا لەپێناو پاراستنی گیانی پێغەمبەردا گیانفیدایانە ژیانی خۆی خستووەتە مەترسییەوە و تەنانەت لە ڕۆژی کۆچکردنیدا بۆ مەدینە لە پێخەفەکەی پێغەمبەری خوادا نوست، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانی پلانی کوشتنی لە ئارادایە.

وەڵامی سەروەری سوڵتانی گوفتار بەجۆرێك بوو کە هەردووکیانی دڵخۆش کرد:

— فاتیمە کچی خۆم! لە ڕوانگەی سۆزی باوکایەتییەوە تۆ خۆشەویستترین کەسی بۆ من، بەڵام بەهای عەلیش لە چاوی مندا زیاترە لە تۆ.

لەناو منداڵەکانی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێبێت) حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لە هەموویان زیاتر شێوەی چووبووە

سەر پێغەمبەری خوا، حەزرەتی عائیشەی دایکمان بەم شێوەیە باسی ئەو لێکچوونە دەکات "کەسم نەدیوە هێندەی فاتیمە لە پێغەمبەری خوا بچێت (درودی خوای لێبێت)."

ڕۆژێك حەزرەتی فاتیمەی دایکمان داوای شانە لە پێغەمبەری خوا دەکات (درودی خوای لێبێت)، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێبێت) خێرا صەفوانی هاوڕێی دەنێرێتە بازاڕ و پێی دەفەرموێت "ئەی صەفوان! خێرا بڕۆ بازاڕ و دوو شانەی عاج بکڕە بۆ فاتیمە."

لە جێیەکی تردا پێغەمبەری ئازیزمان (درودی خوای لێبێت) دەربارەی حەزرەتی فاتیمە دەفەرموێت "فاتیمە پارچەیەکە لە من، ئەوەی ئەو بڕەنجێنێت ئەوە منی ڕەنجاندووە."

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) هەرکاتێك بۆی بڕەخسایە سەردانی ماڵی حەزرەتی فاتیمە و حەزرەتی عەلی دەکرد و لەنێوانیاندا دادەنیشت، حەزرەتی فاتیمەش بە هەمان شێوە زوو زوو سەردانی ئازیزمانی دەکرد و لە خزمەتیدا دەبوو، لە یەکێك لەو جارانەدا پێغەمبەری خوا حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمە و حەسەن و حوسەینی کوڕیان دەهێنێتە ژێر عەباکەیەوە و، لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە و دەفەرموێت "خوای گەورە ئەمانە لە خێزانی منن، لە هەموو خراپەیەك بیانپارێزە و لێیان خۆشببە."

تایبەتمەندییەکی تری حەزرەتی فاتیمەی دایکمان ئەوە بوو کە ڕەچەڵەکی پێغەمبەری سەروەر لە ڕێگەی منداڵەکانی ئەوەوە بەردەوام بووە. بەم هۆیەشەوە نەوەکانی حەزرەتی فاتیمە بە شەریف و سەید بانگکراون و ناوبانگیان دەرکردووە.

# هاوسەرگیریی حەزرەتی فاتیمە

پاش تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر کۆچدا حەزرەتی فاتیمە لەگەڵ حەزرەتی عەلیدا هاوسەرگیری ئەنجامدا.

کاتێك حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) کیژێکی لاو بوو، چەندین کەس داواکاریی هاوسەرگیرییان پێشکەشکرد. بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بەشێوەیەکی جوان ئەم داواکارییانەی دەدایە دواوە، چونکە ئەو کەسەی کە بەختەوەر دەبوو بە هاوسەرێتی حەزرەتی فاتیمە کەسی دی نەبوو جگەلە حەزرەتی عەلی، لەو کاتەدا کە حەزرەتی عەلی دەیویست حەزرەتی فاتیمە بخوازێت گەنجێکی هەژار بوو، تا ئەو ڕادەیەی هیچی شك نەدەبرد بیکاتە مارەیی حەزرەتی فاتیمە، بەڵام بۆ کەسێکی جوامێری وەك حەزرەتی عەلی دۆزینەوەی ڕێگەچارە سەخت نەبوو. ئەوە بوو ئەو غەنیمەتەی لە جەنگی بەدردا دەستی کەوتبوو فرۆشتی و هەندێك زیوی لێکڕی و کردییە مارەیی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان.

لەکاتی گواستنەوەشیدا ناومالەکەی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان پێکهاتبوو لە سەرچەفێکی قەدیفە، پشتییەکی چەرم کە ناوەکەی پووشی خورمای تێدابوو، دوو دانە دەستاڕ و دوو کونەی ئاو لەگەڵ هەندێك بۆنی خۆش. بەمشێوەیە حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمە چوونە کەژاوەی هاوسەرگیرییەوە و خانەی بەختەوەرییان پێکەوەنا. لە ساڵەکانی یەکەمی ئەم هاوسەرگیرییەیاندا حەزرەتی حەسەن و حوسەین هاتنە دنیاوە و لە ساڵەکانی دواتریشدا ئوم کەلسوم و زەینەب و موحسین کە هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کرد هاتنە دنیاوە.

# دابەشکردنی کار

کاتێك حەزرەتی فاتیمەی دایکمان و حەزرەتی عەلی گەشتن بەیەك لەنێو خۆیاندا کارەکانیان دابەشکرد، بەجۆرێك کە هەموو ئیش و کارەکانی دەرەوە حەزرەتی عەلی جێبەجێی دەکرد و کارەکانی ماڵەوەش حەزرەتی فاتیمەی دایکمان جێبەجێی دەکرد.

حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) خۆی لە ماڵەوە بە دستاڕەکەی ئاردی بۆ خۆیان دەهاڕی.

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بە مەبەستی سەردان هاتە ماڵی حەزرەتی فاتیمە، لە دەرگای دا و مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی خواست، ڕەوشتی پێغەمبەری خوا وەهابوو بێ مۆڵەت خواستن هەرگیز نەدەڕۆیشتە ماڵانەوە، پاش ئەوەی مۆڵەتی وەرگرت ڕۆشتە ژوورەوە، بەڵام حەزرەتی عەلی و حوسەینی نەبینی، پرسی:

— کچی خۆم عەلی ئامۆزام لە کوێیە؟

حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

– نازانم بابە گیان، دەنگەدەنگێك لەنێوانماندا دروست بوو، ئەویش هەستا ڕۆشتە دەرەوە ئیدی نازانم لە کوێیە.

لەپاشان پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ڕۆیشتە دەرەوە و بە هاوەڵەکەی وت کە خێرا حەزرەتی عەلی بۆ بدۆزێتەوە. پاش کەمێك هاوەڵەکەی هەواڵی پێگەیاندەوە کە حەزرەتی عەلی لە مزگەوتە، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) ڕۆشتە لای حەزرەتی عەلی و فەرمووی "هەستە ئەی ئەو کەسەی کە خۆی سەرقاڵی خۆڵ کردووە."

کاتێك حەزرەتی عەلی پێغەمبەری خوای بەسەر سەریەوە بینی (دروودی خوای لێبێت) خێرا هەستایەوە سەر پێ و بەیەکەوە ڕۆشتن بۆلای حەزرەتی فاتیمە. پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت)

لەگەڵ هەردووکیان قسەی کرد و کۆتایی بە ناکۆکییەکەی نێوانیان هێنا و ئاشتی کردنەوە، کاتێك لە ماڵی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان و حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) هاتە دەرەوە زەردەخەنە لە لێوی پیرۆزی دەباری، بەجۆرێك کە سەرنجی هاوەڵانی ڕاکێشا و لێیان پرسی:

– ئەی پێغەمبەری خوا کە ڕۆشتیتە ماڵی فاتیمەوە دڵگران و خەمبار بوویت، کە هاتیتە دەرەوە دڵخۆشی بە ڕوخسارتەوە دەرکەوتووە.

پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لێبێت) وەڵامی دانەوە و فەرمووی:

– نێوانی دووکەسی ئازیز و خۆشەویستی خۆم چاککردووەتەوە، ئیدی چۆن دڵخۆش نەبم؟.

# یادی خوای گەورە

حەزرەتی فاتیمە، هەستان و دانیشتن و ڕۆشتن و قسەکردن و...، بەکورتی هەموو هەڵسوکەوتێکی حەزرەتی فاتیمە لە پێغەمبەری خوا دەچوو (دروودی خوای لێبێت). وەك ئەو هەڵدەستا، وەك ئەو دادەنیشت، قسەکردنی وەك ئەو و نیگاشی هەر چووبووەوە سەر ئەو، ژیانە سادەکەشی هەر وەك ژیانی سەروەرمان بوو.

ڕۆژێك کۆمەڵێك دیل هێنرانە مەدینە، کاتێك حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەمەی بیست، ڕاستەوخۆ هاتە لای پێغەمبەری ئازیزمان مەبەستی ئەوەی کە خزمەتکارێك وەربگرێت تا لە کاروبارەکاندا یارمەتی بدات، چونکە حەزرەتی فاتیمە کە هەر خۆی ئاردی بە دەستاڕەکە دروستدەکرد زۆر ماندوو دەبوو، حەزرەتی

عەلیش لە هێنانی ئاوی پێویست لە بیرەکەوە بۆ ماڵەوە، بە هەمان شێوە زۆر ماندوو دەبوو.

بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) داواکارییەکەی حەزرەتی فاتیمەی جێبەجێ نەکرد چونکە ئەو کەسە بۆ کاروباری موسڵمانە هەژارەکان لە مزگەوتەکەدا پێویست بوو، بەڵام لەبری ئەوە پێغەمبەری سەروەرمان ئامۆژگارییەکی حەزرەتی فاتیمەی کرد و پێی فەرموو "کاتێك دەڕۆیتە جێگاوە سی و سێ جار "سبحان الله" و سی و سێ جار "الحمد لله" و سی و سێ جار "الله أکبر" بخوێنە باشترە لە هەر خزمەتکارێك".

حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەیفەرموو حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) هەرگیز ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوای (دروودی خوای لێبێت) واز لێ نەهێنا و بەردەوام جێبەجێی دەکرد.



# حەزرەتی فاتیمەی
# دایکمان و نوێژکردن

پاش ئەوەی ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە داوای لە سەروەرمان دەکرد فەرمان بکات بە ئەندامانی خێزانەکەی بۆ بەئەنجام گەیاندنی نوێژ، ئیدی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) وەك خوویەك هەموو بەیانییەك حەزرەتی فاتیمەی دایکمانی بە خەبەردەهێنا بۆ نوێژی بەیانی.

حەزرەتی حوسەین کاتێك منداڵ بوو، جارێکیان نەخۆش دەبێت و تا دەرەنگانێك ناخەوێت، حەزرەتی فاتیمەی دایکمان زۆر ماندوو دەبێت بە دیارییەوە و ناتوانێت بنوێت، تا ئەوەی نزیك کاتی نوێژی بەیانی حەزرەتی حوسەین دەنوێت، حەزرەتی فاتیمەی دایکیشمان نوێژی

بەیانی دەکات و دەنوێت. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) لەپاش نوێژی بەیانی سەرێك دەدات لە حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت).

کاتێك دەبینێت حەزرەتی فاتیمە نوستووە (ڕەزای خوای لێبێت) وادەزانێت بەخەبەرنەهاتووە بۆ نوێژی بەیانی، بۆیە بانگی دەکات و پێی دەڵێت "کچی شیرینم! نەکەیت پشت بەوە ببەستیت کە کچی پێغەمبەری خوایت و کەمتەرخەمی لە نوێژەکانتدا بکەیت، سوێند بە خوای گەورە ئەگەر پێنج نوێژە فەرزەکان ئەنجام نەدەیت، ناچیتە بەهەشتەوە."

جارێکی دیکەش کاتێك حەزرەتی فاتیمە لە کاتی نوێژی بەیانیدا خەوی لێدەکەوێت، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) پێی دەفەرموێت "کچی شیرینم هەستە و لە بێ ئاگایان مەبە! ئامادەبە بۆ ئەو ڕۆزییەی کە نیعمەتی خوای گەورەیە، چونکە کاتی دابەشکردنی ڕزق و ڕۆزی لەنێوان دەرکەوتنی سپێدە و هەڵهاتنی خۆردایە."

ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری سەروەرمان سەبارەت بە نوێژ بۆ حەزرەتی فاتیمە تەنها لە نوێژی بەیانیدا سنووردار نەبوو، بەڵکو لە کاتی سەرجەم نوێژەکانی تریشدا سەری لێدەدا و پێی دەفەرموو "هەستن بۆ نوێژ، ئەی ئەندامانی خێزانی محەممەد!"

لەپاش ئەم بانگکردنەشی پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتە پیرۆزەی دەخوێندەوە:

"ئەی ئەندامانی خێزانی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە دەیەوێت لێتان خۆشببێت و بە پاکی بتانهێڵێتەوە."

بەڵێ، حەزرەتی فاتیمە ئەگەر فەرزەکانی پەروەردگاری جێبەجێ نەکردایە، ئەوا کچی پێغەمبەری خوا بوون هیچ سوودێکی پێنەدەگەیاند و پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێبێت) خۆی بەمجۆرە ئەمەی بۆ ڕوون دەکردەوە.

"فاتیمە! کیژی خۆشەویستم، خۆت لە ئاگری دۆزەخ بپارێزە، دڵنیابە ئەگەر فەرمانەکانی خوای گەورە جێبەجێ نەکەیت و لە کارە قەدەغەکراوەکان دوورنەکەویتەوە، من ناتوانم لە ئاگر ڕزگارت بکەم. من لێرە لەم دنیایەدا ڕەچاوی خزمایەتی دەکەم و بەچاکە ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەم، بەڵام بۆ پاراستنتان لە شەڕی دواڕۆژ من

هەر لەو پیاوە دەچم کە بۆ پاراستنی خێزانەکەی لە دوژمن پێیان دەڵێت "هەڵبێن!". من تەنها ئەوەم پێدەکرێت ئاگادارتان بکەمەوە کە خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بەدوور بگرن، ئیدی بۆ ڕزگاربوونتان لە دۆزەخ کارێکە لە دەستی خۆتاندایە.“



# دایە فاتیمە و

# قوربانیکردن

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لە کاتی جەژنی قوربانا کیژە خۆشەویستەکەی خۆی (حەزرەتی فاتیمەی دایکمان)ی بانگدەکردە لای خۆی و پێی دەفەرموو:

"فاتیمە! وەرە لای قوربانییەکەت بوەستە، چونکە لەگەڵ ڕژانی یەکەم دڵۆپە خوێنی قوربانییەکەتدا خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانت خۆشدەبێت. کاتی قوربانیش پێویستە ئەم ئایەتە بخوێنیت کە دەفەرموێت:

"بەڕاستی نوێژ و حەج و دروشمەکانی (سەرجەم چاکە و

بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان."

جارێکیان حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەفەر دەگەڕێتەوە، حەزرەتی فاتیمەش لە گۆشتی قوربانییەکە خوانێکی ڕازاوە بۆ هاوسەرەکەی سازدەکات. بەڵام نیشانەیەکی پرسیار لای حەزرەتی عەلی دروست دەبێت، ئەویش ئەوەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) پێشتر قەدەغەی کردبوو لە سێ ڕۆژ زیاتر گۆشتی قوربانی لە ماڵەوە بهێڵرێتەوە.

بەڵام حەزرەتی فاتیمە بەردەوام لەنزیک پێغەمبەری خوا بوو، بۆیە زۆرباش دەیزانی پێغەمبەری خوا چی وتووە و کەی وتویەتی.

هەر بۆیە لە وەڵامی حەزرەتی عەلیدا فەرمووی:

"بەڵێ، لەپێشدا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ئەوەی قەدەغە کردبوو، بەڵام لەپاشان ئەو قەدەغەیەی هەڵگرت."

ماڵی حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوایان لێبێت) هەر لە کۆتایی ماڵەکانی پێغەمبەری خوادا بوو، بۆیە حەزرەتی عەلی یەکسەر هەستایەوە و ڕۆشت بۆلای پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) تاوەکو لە سەرچاوە سەرەکییەکەوە ڕاستییەکە ببیستێت.

پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێبێت) پێی فەرموو:

"عەلی! گەر گۆشتی قوربانی ئەمساڵ لە جەژنی قوربانی داهاتووشدا بخۆیت هیچ کێشەیەکی نییە."

# خۆپاراستن لە زیادەڕۆیی (ئیسراف)

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) لە پەنجەی کیژێکی بچووکی خزمیدا ئەنگوستیلەیەکی زێڕی بەدیکرد، بانگیکردە لای خۆیەوە و بە هێواشی کێشای بە دەستیدا و نیگەرانی خۆی سەبارەت بە ئاڵتوون لەپەنجەکردنی نیشاندا، کیژەکەش زۆر دڵگرانبوو لەوەی کە بەبێ ئەوەی بیەوێت پێغەمبەری خوای دڵگران کردووە. لەپاشان کیژەکە هاتەوە لای حەزرەتی فاتیمەی دایکمان و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، حەزرەتی فاتیمەش ملوانکەکەی ملی خۆی بیرهاتەوە، بۆیە یەکسەر لە ملی کردەوە. لەو کاتەدا کە بە دەستیەوە بوو، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) هاتە ژوورەوە، کە ملوانکەکەی بە دەستیەوە بینی پێی فەرموو:

"فاتیمە! ئایا دەتەوێت خەڵکی بڵێن زنجیرێکی ئاگراوی بە دەستی کچی پێغەمبەری خواوەیە؟"



لەڕاستیدا زۆر ئاساییە کە ئافرەت ئاڵتوون بەخۆیەوە بکات بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) زۆر هەستیار بوو بەرامبەر خزمانی خۆی و دەیویست ژیانێکی سادە بژین.

لەپاش ئەم قسانە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) دانەنیشت و ڕۆشت، حەزرەتی فاتیمەش زۆر زیرەك بوو، لە واتای ئەم ڕەفتارەی پێغەمبەرمان بە چاکی تێگەیشت، بۆیە خێرا بە کەسێکدا ملوانکەکەی ناردە بازاڕ و بە پارەکەی پێداویستی کەسێکی هەژاری جێبەجێکرد. کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) هەواڵەکەی بیست فەرمووی:

"سوپاس بۆ خوای گەورە کە فاتیمەی لە ئاگر ڕزگارکرد."

جارێکی تر بە هەمان شێوە پێغەمبەر دەڕوات بۆ ماڵی حەزرەتی فاتیمە، بەڵام یێتەوەی بڕواتە ژوورەوە دەگەڕێتەوە و دەڕوات. حەزرەتی عەلی بەمە زۆر خەمبار بوو، خێرا دەڕواتە لای د

هۆکاری نەچوونە ژوورەوەکەی لێ دەپرسێت. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) لە وەڵامدا دەفەرموێت:

"بە دەرگای ماڵەکەتانەوە پەردەیەکی پێوەیە کە بە نەخش و وێنە ڕازێنراوەتەوە."

ئەوە دڵگرانی کردم و وایکرد بگەڕێمەوە، خۆت دەزانیت من بە هەموو شێوەیەك خۆم بەدوور دەگرم لە کاری بێ سوود و زیادەڕۆیی.

حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بەسەرهاتەکەی بۆ حەزرەتی فاتیمە گێڕایەوە، حەزرەتی فاتیمەش یەکسەر پەردەکەی لادا، حەزرەتی عەلی هەواڵی دایەوە بە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت)، سەروەریشمان لە وەڵامدا فەرمووی:

"با فاتیمەی کچم پەردەکە ببەخشێت بە فڵانە ماڵ کە پێویستیان پێیەتی."

حەزرەتی فاتیمەی دایکیشمان خێرا فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای جێبەجێکرد و پەردەکەی بەخشی.

# نزاکەی حەزرەتی
# فاتیمەی دایکمان

جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بە کیژە خۆشەویستەکەی فەرموو:

— فاتیمە کچم! نزایەکت فێر دەکەم بە شەو و بە ڕۆژ بیخوێنە:

"ئەی ئەوەی کە زیندوویت و بەردەوامیش دەمێنیت، ئەی ئەو کەسەی هەمیشە هەبوویت، بە توانستی بێ پایانت بوونەوەرت بەدیهێناوە، بە سۆز و بەزەیی خۆت داوات لێدەکەم، کاروبارم بە چاك بگێڕە و بە ئەندازەی چاوتروکاندنێکیش خۆم نەدەیتە دەست نەفسی خۆم."

# هەستیاری بەرامبەر صەدەقە

حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمەی دایکمان و منداڵەکانیان لە خێزانی پێغەمبەری خوا بوون (دروودی خوای لێبێت) بۆیە صەدەقەیان پێنەدەشا، واتە نەدەبوو ماڵی خێر بۆ خۆیان بەکاربهێنن، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) زۆر هەستیار بوو لەم بابەتەدا. بۆ نموونە کاتێك حەزرەتی حوسەین هێشتا منداڵبوو دەنکێك خورمای لەو خورمایەی خستە دەمیەوە کە وەك صەدەقە بۆ پێغەمبەر هاتبوو تا بیبەخشێت، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) خورماکەی لە دەمی دەرهێنایەوە و پێی فەرموو:

"کوڕی خۆم! مەگەر نازانیت کە ئێمە لە ماڵی صەدەقە ناخۆین؟!"



# ئازاری جودایی

## خوشک

حەزرەتی ڕوقیەی خوشکی حەزرەتی فاتیمە لەپاش کۆچی مەدینە نەخۆشکەوت، کاتێك جەنگی بەدر نزیکبوویەوە بە تەواری نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێنا. حەزرەتی عوسمانی هاوسەریشی بەوهۆیەوە نەیتوانی بەشداری جەنگی بەدر بکات و ناچار لای ئەو مایەوە، هێندەی نەبرد حەزرەتی ڕوقیە (ڕەزای خوای لێبێت) کۆچی دوایی کرد و گەڕایەوە بارەگای خوای گەورە. حەزرەتی فاتیمەش لە جودایی خوشکەکەی خەمبار بوو و فرمێسکی بۆ هەڕشت، پێغەمبەری خواش دڵنەوایی حەزرەتی فاتیمەی کرد و فەرمێسکەکانی سڕی.

# حەزرەتی فاتیمەی دایکمان
# لە جەنگی ئوحوددا

فیداکاری و قارەمانێتی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لە جەنگی ئوحوددا، داستانی سەر زمانانە، ئەو لەلایەك ئازوقە و خواردنی دەگواستەوە بۆ جەنگاوەران و لەلایەکی تریشەوە برینپێچی بۆ بریندارەکانی جەنگ دەکرد. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) لەنێو بریندارەکاندا بوو، موسڵمانان ڕووبەڕووی جەنگێکی زۆر سەخت بوونەوە. بێباوەڕانیش یەك ئامانجیان هەبوو، ئەویش زیانگەیاندن بوو بە پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت). یەکێك لە بێباوەڕان بە ناوی عوتبە چوار بەردی بەدوای یەکدا بەرەو موسڵمانان وەشاندبوو، یەکێك لەو بەردانە بەر دەموچاوی پێغەمبەری ئازیزمان کەوتبوو، ددانێکی سەروەرمانی شکاند، لێوی پیرۆزیشی بریندار کرد. ئەوەبوو حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ئاوی دەکرد بە دەستی حەزرەتی فاتیمەدا و ئەویش برینەکانی پێغەمبەری خوای (دروودی خوای لێبێت) دەسڕی.

پێغەمبەری ئازیزیشمان لەلایەك ئەو خوێنەی دەمڕی ی بەدەموچاویدا دەهاتە خوارەوە و لە لەلایەکیشەوە نزای دەکرد و لە خوای گەورە دەپاڕایەوە:

"خوایە گیان! لە گەلەکەم خۆشببە چونکە ئەوان گومڕا و نەزانن، سا خوایە هیدایەتیان بدە چونکە ئەوان هێشتا نازانن من کێم."

لەپاشان حەزرەتی فاتیمە بینی بەهۆی ئاوەکەوە خوێن بەربوونەکەی پێغەمبەری خوا زۆرتر دەبێت، بۆیە پارچە حەسیرێکی هەلگرت و جوان سوتاندی تا بوو بە خۆڵەمێش و پاشان برینەکەی پێغەمبەری خوای پێبەست. ئیدی هێندەی نەبرد خوێنەکە وەستایەوە.

# پێغەمبەری دادپەروەر

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لێبێت) یەکێک لە ژنە خانەدانەکانی مەککە بە ناوی فاتیمەوە دزی کردبوو. سەپاندنی سزا بەسەر ئەو ژنەدا زۆر سەخت بوو بۆ ئەو خێزانە خانەدانە و زۆر لەسەر ناوبانگیان دەکەوت، هەربۆیە حەزرەتی ئوسامەیان ڕاسپارد کە بڕواتە لای پێغەمبەری خوا سا بەڵکو ئاسانکارییان بۆ بکات و سزا نەدرێت، حەزرەتی ئوسامەش هاتە خزمەت پێغەمبەری ئازیزمان و هۆکاری سەردانەکەی پێ وت، بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) زۆر دلگرانبوو و پێی:

"ئەی ئوسامە! ئایا تۆ هاتوویت تکا بۆ کەسێك بکەیت تا ڕزگاری بکەیت لە سزایەك کە خوای گەورە بۆی داناوە؟!"

حەزرەتی ئوسامە (ڕەزای خوای لێبێت) هەستی بە هەڵەکەی خۆی کرد بەڵام تازە هەڵەیەك بوو ئەنجامی

دابوو، بۆیە داوای لە پێغەمبەری خوا کرد (دروودی خوای لێبێت) و فەرمووی:

"ئەی پێغەمبەری خوا! نزام بۆ بکە تا خوای گەورە لێم خۆشبێت."

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) خێرا چووە سەر مینبەر و بە خەڵکی ڕاگەیاند:

"ئەی خەڵکینە! ئوممەتەکانی پێش ئێوە سزای کەسە بە دەسەڵات و دەوڵەمەندەکانیان نەدەدا کە تاوانیان دەکرد. بەڵام ئەگەر کەسێکی هەژار تاوانێکی بکردایە یەکسەر سزایان دەدا، بەهۆی ئەم نادادپەروەرییەشیانەوە ڕووخان و لەناوچوون. سوێندبێت بە خوای گەورە ئەگەر فاتیمەی کچیشم دزی بکات، ئەوا سزای خۆی دەدەم."

# منداڵەکانی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان

لە سەرەتای ساڵەکانی هاوسەرگیریی حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمەی دایکماندا (ڕەزای خوایان لێبێت)، حەزرەتی حەسەن و حەزرەتی حوسەین هاتنە دنیاوە و لە ساڵەکانی دواتریشدا حەزرەتی ئوم کەلسوم و زەینەب و موحسین لەدایکبوون. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی منداڵەکانی حەزرەتی فاتیمە ئەوە بوو لە نەوەی پیرۆزی پێغەمبەری خوا بوون. ئەوەتا پێغەمبەری خوا دەفەرموێت "لە ڕۆژی قیامەتدا سەرجەم پێبەندە خزمایەتییەکان کۆتاییان پێدێت، بەڵام خزمایەتیی من بەردەوام دەبێت، هەموو منداڵێك بە ناوی باوکی خۆیەوە بانگ دەکرێت، بەڵام منداڵەکانی فاتیمە بە ناوی منەوە بانگ دەکرێن." بەم وتانەش پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) وەك باپیرەیەکی دڵسۆز خۆشەویستیی خۆی بۆ نەوەکانی دەردەبڕی.



# حەزرەتی حەسەن

حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) لە دواین ساتەکانی دووگیانیدا بوو بە حەزرەتی حەسەنەوە (ڕەزای خوای لێبێت). کاتێك ژان گرتی، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) حەزرەتی عەلی نارده لای و پێی فەرموو:

"بڕۆ لای فاتیمەی هاوسەرت و "آیة الکرسي" و سورەتی "الفلق" و سورەتی "الناس" بخوێنە بۆئەوەی بە ئاسانی منداڵەکەی ببێت، پاشانیش ئەم ئایەتە بخوێنە:

"بێگومان پەروەردگارتان "الله"یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە لە ماوەی شەش ڕۆژدا، پاشان لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی وەستا، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان)

بە فەرمانی خوا کەوتوونەتە گەڕ و لە فەرمانی دەرناچن. ئاگادار بن و بزانن و تێبفکرن کە هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، و پیرۆز و گەورەیە زاتی "الله" پەروەردگاری جیهانیان."

لەم نێوەندەشدا ئوم فەزلی خێزانی حەزرەتی عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) خەون دەبینێت. لە خەونیدا لە ماڵی خۆیدا شتێك دەبینێت کە هی پێغەمبەری خوایە. کاتێك ڕۆژدەبێتەوە دێتە لای پێغەمبەری خوا و خەونەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) واتای ئەو خەونەی بەوە لێکدەداتەوە کە حەزرەتی فاتیمە کوڕێکی دەبێت. هەر بەو شێوەیەی پێغەمبەری خوا ئاماژەی پێدابوو زۆری نەبرد حەزرەتی فاتیمەی دایکمان بەئاسانی منداڵەکەی بوو، کە کوڕێکی جوانی خنجیلانە بوو. لەپاش کەمێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) هاتە ماڵی حەزرەتی فاتیمە و فەرمووی:

"کوڕەکەم پێ نیشان بدەن. ئایا بەنیازن ناوی بنێن چی؟"

حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمەی دایکمان وایان دانابوو ناوی جگەرگۆشەکەیان بنێن "حەرب".

بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ئەو ناوەی بە گونجاو نەزانی و ناوی لێنا "حەسەن". پاشان پێغەمبەری خوا حەسەنی ئەوەی خۆی گرتە باوەش و بانگی خوێند بە

گوێی ڕاستیدا و قامەتی کرد بە گوێی چەپیدا و فەرمانیدا هێندەی قورسایی قژی حەسەن ئاڵتوون بکرِن و بەسەر هەژاراندا دابەشی بکەن.

حەزرەتی حەسەنیش بە هەمان شێوەی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان زۆر لە پێغەمبەری خوا دەچوو (درودی خوای لێبێت) بۆیە هەمیشە کە حەزرەتی فاتیمە کوڕە شیرینەکەی دەلاواندەوە دەیوت:

"ئەی کوڕە شیرینەکەم، ئەی ئەو ڕۆڵەیەی لە باپیرت دەچیت نەك لە باوکت."

# حەزرەتی حوسەین

حەزرەتی حوسەین دووەم کوڕی حەزرەتی فاتیمە بوو. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) خۆی بانگیدا بە گوێی ڕاستیدا و قامەتی کرد بە گوێی چەپیدا و ناوی لێنا حوسەین. پێغەمبەری خوا ئەم نەوە بچووکەی زۆر خۆشدەویست، تەنانەت یەکەم جار کە حەزرەتی حوسەین لە دوای شیری دایکی خواردنی خوارد، بە دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوا بوو، کە پارچەیەك خورمای کرد بە دەمیەوە.

# حەزرەتی موحسین

سێیەم کوڕی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) حەزرەتی موحسین بوو. پاش لەدایکبوونی، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) هاتە لای حەزرەتی فاتیمە و نەوەکەی خۆی ناونا موحسین. لەپاشان بانگیدا بە گوێی ڕاستیدا و قامەتی کرد بە گوێی چەپیدا. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم موحسین نەخۆشکەوت، لە ماوەیەکی کورتدا نەخۆشییەکەی پەرەی سەند و هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کرد.

بەر لەوەی موحسین کۆچی دوایی بکات، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لەگەڵ کۆمەڵێك هاوەڵیدا هاتن بۆ سەردانی، کاتێك پێغەمبەری خوا ئامادەی گیانسپاردنی نەوەکەی بوو زۆر دڵگران بوو.

ئەسرین بە چاوەکانی سەروومرماندا دەهاتە خوارەوە، هاوەڵێکی لێی پرسی "ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە بۆ دەگریت؟"

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لە وەڵامدا پێی فەرموو "ئەمە ئەنجامی ئەو سۆز و ڕەحمەتەیە کە خوای گەورە خستوویەتییە دڵی مرۆڤەکانەوە، خواوەند تەنها سۆز و بەزەیی بەو کەسانەدا دێتەوە کە سۆز و بەزەییان هەیە."

# هاودەمە بچووکەکەی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان

ساڵی حەوتەمی کۆچی بوو پێغەمبەری خوا و هاوەڵان هاتبوونە مەککە بۆ ئەنجامدانی عومرە، لەپاش بەئەنجام گەیاندنی عومرەکە پێغەمبەری خوا بەنیازبوو مەککە جێبهێڵێت، بەڵام بەشوێنیدا هاوار و گریانی منداڵێك بەرزبوویەوە. ئەو منداڵەش کچی حەزرەتی حەمزە بوو (ڕەزای خوای لێبێت). لەبەرئەوەی بەرگەی جودایی لە پێغەمبەرمان نەدەگرت، ڕایدەکرد بە شوێنیدا و دەیوت "مامەگیان! مامەگیان"، ئیدی حەزرەتی عەلیش (ڕەزای خوای لێبێت) ئەم کیژە بچووکە هەڵدەگرێت و لای حەزرەتی فاتیمەدا دایدەنیشێنێت و بەمجۆرە لەگەڵ خۆیاندا دەیهێننەوە بۆ مەدینە.

کاتێك گەیشتنە مەدینە هێشتا دیارنەبوو کیژە بچووکەکە لە کوێ دەمێنێتەوە. حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەیویست منداڵەکە بباتەوە ماڵی خۆی، بە هەمان شێوە حەزرەتی جەعفەری برای و زەیدی کوڕی حاریسەش دەیانویست منداڵەکە ببەنەوە لای خۆیان. پێغەمبەری خواش پێی فەرموون "پوور وەك دایك وایە." بۆیە ئەرکی پەروەردەکردنی بەخشییە خێزانی حەزرەتی جەعفەر (ڕەزای خوای لێبێت) کە لە هەمان کاتدا پووریشی بووە. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بیری لە دڵدانەوەی حەزرەتی عەلی و حەزرەتی زەیدیش کردبوویەوە کە بە هەمان شێوە دەیانویست ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵەکە بگرنە ئەستۆ.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بە حەزرەتی عەلی فەرموو (ڕەزای خوای لێبێت):

"من وابەستەی تۆم و تۆش وابەستەی منیت!"

بەم وتەیە ئاماژەی بۆ نزیکیی نێوان خۆی و حەزرەتی عەلی دەکرد، دڵنیای کردەوە کە کەسی نزیکی خۆیەتی و دڵی دایەوە.

گرنگیدانی پێغەمبەری نازدارمان (دروودی خوای لێبێت) بۆ حەزرەتی زەید بەم شێوەیە بوو، پێی فەرموو "تۆ برا و دۆستی بەوەفای ئێمەیت."

سەرودەرمان (درودی خوای لێبێت) بە حەزرەتی جەعفەریشی (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموو:

"تۆ زۆر لە من دەچیت هەم لە ڕوخسار و هەم لە هەڵسوکەتیشدا."

# ژیانی سادەی فاتیمەی دایکمان

ڕۆژێك حەزرەتی فاتیمەی دایکمان دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) تا داوای شتێکی لێ بکات.

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێت:

"سوێند بە خوای گەورە سێ ڕۆژە ئاگر لە ماڵمان نەکراوەتەوە."

لەپاشان پێی دەفەرموێت "کچی شیرینم! با کۆمەڵێك نزات فێر بکەم، کە لە خوای گەورە پاڕایتەوە بەمجۆرە بپاڕێوە، ئەم نزایانە حەزرەتی جوبرەئیل فێری کردووم"

"ئەی ئەو خوایەی لەدوای هەموو شتێکەوە هەردەمێنیت. کە لەپێش هەموو شتێکەوە هەبوویت، ئیلاهی! ئەی ئەو کەسەی خاوەنی توانایەکی بەهێزی لەبن نەهاتوویت. ئەی ئەو پەروەردگارە

دڵسۆزەی بە شەفەقەت و دڵسۆزیی خۆت هەژاران دەپارێزیت
ئیلاهی! ئەی ئەو کەسەی لە هەموو کەسە بەسۆز و میهرەبانەکان
بەسۆزتر و میهرەبانتریت"

# موژدەیەک لە ڕێی حەزرەتی فاتیمەی دایکمانەوە

لە سەردەمی جاهیلیدا عەرەبەکان خۆشیان بە منداڵی کچ نەدەهات، بگرە بە مایەی شەرمەزارییان دەزانی. ئەگەر یەکێکیان هەواڵی بوونی منداڵی کچی پێبدرایە بۆ ڕزگاربوون لەو شەرمە هەر بە زیندوویی کیژۆڵەکەی زیندەبەچاڵ دەکرد.

قورئانی پیرۆز بەمشێوەیە باسی ئەو هەستەی ئەوانمان بۆ دەکات:

"خۆ ئەگەر یەکێك لەوانە مزگێنیی لەدایکبوونی کچی پێ بدرێت، ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت، ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە. خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی لەبەر ئەو مژدە خراپەی پێی دراوە، ئایا بیهێڵێتەوە بە سەرشۆڕی یان زیندەبەچاڵی بکات، بێداربن ئای چەند خراپە ئەو بڕیارەی دەیدەن."

ئەوان حەزیان دەکرد منداڵی کوڕیان ببێت چونکە

وا بیریان دەکردەوە کە منداڵی کوڕ دەبێتە شوێنگرەوەی خۆیان و ناویانگی پێ پەیدادەکەن. بەڵام بەهۆی هەر دانایییەکی خوای گەورەوە بێت، پێغەمبەری خوا هەموو منداڵە کوڕەکانی هەر بە منداڵی کۆچی دواییان کرد. لەبەرئەوەش کە پێغەمبەر منداڵە کوڕەکانی دەمردن، بێباوەڕان بە پێغەمبەریان دەوت "أبتر" واتە وەجاخکوێر. بەڵام خوای گەورە بە سورەتی کەوسەر موژدەی زۆر شتی باشی پێدا، چونکە وەچەی پێغەمبەری خوا لە ڕێی حەزرەتی فاتیمەوە بەردەوام بوو، کە باشترین وەچە و ڕەچەڵەکە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

# ستایشکردنی حەزرەتی
# فاتیمەی دایکمان

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بەردەوام ستایشی حەزرەتی فاتیمەی دایکمانی دەکرد و دەیفەرموو:

"ئەو ئافرەتانەی لە بەهەشت بەرزترین پلەیان هەیە حەزرەتی خەدیجە (خێزانی پێغەمبەر) و حەزرەتی فاتیمە و، حەزرەتی مەریەمی کچی عیمران و ئاسیای کچی موزاحیمی خێزانی فیرعەونە (ڕەزای خوایان لێبێت)."

لە شوێنێکی دیکەشدا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) فەرموویەتی "حەزرەتی مەریەم باشترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بوو، باشترین ئافرەتی ئەم سەردەمەش حەزرەتی فاتیمەیە".

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەربارەی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان دەیفەرموو:



"لەپاش پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) هیچ کەسێکی تری باش و کامڵم نەبینیوە جگە لە حەزرەتی فاتیمە(ڕەزای خوای لێبێت)."

کاتێك پرسیار لە حەزرەتی عائیشە دەکرا (ڕەزای خوای لێبێت) کە "ئایا پێغەمبەری خوا بە زۆری کێی لە هەموو کەس زیاتر خۆشویستووە؟" دەیفەرموو:

"کەس هێندەی حەزرەتی فاتیمە لە پێغەمبەری خواوە نزیك نەبووە."

ڕۆژێکیان فریشتەیەك دێتە لای پێغەمبەری خوا و مژدەی ئەوەی پێدەدات کە "حەزرەتی حەسەن و حوسەین گەورە و سەرداری گەنجانی بەهەشت دەبن و، حەزرەتی فاتیمەی دایکیشمان گەورە و سەرداری ئافرەتان دەبێت لە بەهەشتدا."

حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ژیانی دنیای بەسەربرد. بەڵام ئەم پێکەوەبوونە تەنها بە ژیانی دنیاوە سنووردار نەبوو، بەڵکو پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) مژدەی ئەوەی پێدا کە لە ژیانی دوارۆژیشدا هەر لەگەڵ ئەودا ژیان بەسەر دەبات.

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) دەڕواتە سەردانی حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمەی کچی، لەو دەمەدا حەزرەتی عەلی نوستووە و هەردوو منداڵەکانیش (حەزرەتی حەسەن و حوسەین) کە منداڵ دەبن تینوویانە، پێغەمبەری خوا مەڕێکی حەزرەتی عەلی دەدۆشێت و لەپێشدا شیرەکەی دەداتە حەسەن.

کاتێك حەزرەتی فاتیمە ئەمە دەبینێت بە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت "ئەی پێغەمبەری خوا! دەڵێیت حەسەنت زیاتر خۆشدەوێت."

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت "نەخێر لەپێشدا ئەو داوای کرد بۆیە دام بە ئەو."

لەپاشان مژدە بە حەزرەتی فاتیمە دەدات و پێی دەفەرموێت "من و تۆ و ئەوەی لەوێدا وەستاوە لە ڕۆژی دواییدا لە یەك شوێندا دەبین."

# یادگارییەکانی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا

حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) لەو ساتەوەی چاوی بە دنیا هەڵهێناوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووە (دروودی خوای لێبێت) بەم هۆیەشەوە چەندین یادەوەری لەگەڵ سەروەرمان هەیە، هەندێك لە یادەوەرییەکانیش بەمشێوەیە.

"جارێك حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) نەخۆش دەکەوێت، پێغەمبەری خوا لەگەڵ هاوەڵێکیدا دێتە سەردانی فاتیمەی کچی. کاتێك چاوی پڕ بە فرمێسکی حەزرەتی فاتیمە دەبینێت دەپرسێت:

- کچی شیرینم بۆ دەگریت؟

- بابە گیان بەهۆی ئازاری نەخۆشییەکەمەوە دەگریم.

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) بەمشێوەیە دڵی حەزرەتی فاتیمە دەداتەوە ”کچی شیرینم تۆ هەموو ئەو شتە چاك و باشانەت هەیە کە موسڵمانان خۆزگەی پێدەخوازن. خاوەنی هاوسەرێکی خووڕەوشت جوانی وەك حەزرەتی عەلیت کە لە موسڵمانە یەکەمینەکانە و خاوەنی دوو منداڵی باشیت، کە سەردار و گەورەی گەنجانی بەهەشتن.“

بەسەرهاتێکی تریشمان بەمشێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە ”ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لە ماڵی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان دەبێت، حەزرەتی فاتیمەش بۆ خوان گۆشتی سوورەوەکراو ئامادە دەکات بۆ پێغەمبەری خوا، لەوساتەدا بیلالی حەبەشی بانگ دەدات و پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) هەڵدەستێتەوە بڕوات بۆ نوێژ. تا ئەو کاتە حەزرەتی فاتیمەی دایکمان وایدەزانی بە خواردنی گۆشت دەستنوێژ دەشکێت بۆیە لە پێغەمبەری خوای پرسی ”ئایا دەستنوێژ ناگریتەوە؟“

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت ”کەی پێویستە لەدوای خواردنی گۆشت دەستنوێژ بگیرێتەوە؟“

# گرنگیی سوژده

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) بەردەوام ئامۆژگاری حەزرەتی فاتیمەی دایکمانی دەکرد کە زۆر سوژدە بۆ خوای گەورە ببات، سەرداری مرۆڤایەتی هۆکارەکەشی بەمشێوەیە ڕوون دەکردەوە:

"کاتێك مرۆڤ دەڕواتە سوژدەوە خوای گەورە پلەی بەرزتر دەکاتەوە لە بەهەشت و لە گوناهی خۆشدەبێت."

# ئەو نزایەی پێویستە
# بەر لە نوستن بخوێنرێت

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بەردەوام ئامۆژگاری حەزرەتی فاتیمەی دایکمانی دەکرد کە بەر لە نوستن ئەم نزایە بخوێنێت.

"سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە دەسەڵات و توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت... پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزن. خوای گەورە بەسە پشتوپەنام بێت، ئەو ویستی لەسەر هەرچی بێت دەیکات. دوعای دوعاکار دەبیستێت و قبوولی دەکات، هەروەك چۆن جگە لە خوای گەورە پشتوپەنای دی نییە. کەسیش نییە لەدوای ئەو پشتی پێ ببەستیت. پشت بە پەروەردگار دەبەستم. هیچ بوونەوەرێك نییە قەدەری بە دەست خوای باڵادەست نەبێت. خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران و سزای خراپەکارانیش دەداتەوە. سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی منداڵی نییە، هاوتای نییە و پێویستی بە کەس نییە."

لەپاشان حەزرەتی فاتیمە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت دواتر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) فەرمووی:

"هەر موسڵمانێك ئەو نزایە بخوێنێت نە شەیتان و نە مارومێروو زیانی پێ ناگەیەنێت"

# ساتی گیرابوونی نزا
# لە ڕۆژی هەینیدا

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) فەرمووی:

"کاتێك هەیە لە ڕۆژی هەینیدا هەر نزایەکی تێدا بکرێت گیرادەبێت."

حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) پێی فەرموو "ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو ساتە کەیە کە باسی دەکەیت؟"

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە "ئەو ساتە لەکاتی بەرەو ئاوابوونی خۆرەوە دەست پێ دەکات، تا خۆر بە تەواوی ئاوا دەبێت."

حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە زۆر بە هەستیاری هەوڵی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوای دەدا.

هەربۆیە لەدوای ئەو جارەشەوە هەموو ڕۆژێکی هەینی، لە کاتێکدا خۆر بەرەو ئاوابوون دەڕۆشت دەستی دەکرد بە نزاکردن، تا خۆرئاوا دەبوو نزای دەکرد. دواتریش نوێژی شێوانی ئەنجام دەدا.

# کاتی خوڕاوابوون

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا بوو، کەسە نزیکەکانی هەموو لە چواردەوری گردبووبوونەوە، لەم نێوەندەدا حەزرەتی فاتیمەی کچیشی هات بۆلای، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو "بەخێربێیت" و داوای لێکرد لەتەنیشت خۆیدا دابنیشێت.

دواتر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) چەمایەوە و چپاندی بە گوێی حەزرەتی فاتیمەدا و فەرمووی:

"هەموو ساڵێك حەزرەتی جوبرەئیل دەهاتە لام و پێکەوە خەتمێکی قورئانی پیرۆزمان دەکرد، بەڵام ئەمساڵ حەزرەتی جوبرەئیل دوو جار هاتە لام بۆ ئەو مەبەستە، ئەمەش واتای هاتنی ئەجەلم دەگەیەنێت."

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) تەنانەت لە کۆتا ساتەکانی ژیانیشیدا داوای لە کچە خۆشەویستەکەی



کرد که له پەروەردگار بترسێت و ئارامگر بێت، بەڵام ئەو قسانەی پێغەمبەری خوا وەك پارچەیەك ئاگر کەوتە دڵی حەزرەتی فاتیمەوە و دەستیکرد بە گریان.

کاتێك پێغەمبەری خوا ئەسرینی چاوی جگەرگۆشەکەی بینی خۆی پێ ڕانەگیرا، دووبارە کچەکەی بانگکردەوە لای خۆی و شتێکی تری چپاند بە گوێیدا. ئەمجارە حەزرەتی فاتیمە ڕوخساری گەشایەوە و زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ئەوەی پێڕاگەیاندبوو لەدوای خۆی یەکەم کەس کە لەنێو خێزانەکەیدا پێی دەگاتەوە ئەو دەبێت، هەروەها موژدەی ئەوشی پێڕاگەیاند حەزرەتی فاتیمە دەبێتە سەرداری خانمانی بەهەشت.

ئەوانەی لەچواردەوری بوون هیچ لەو گفتوگۆیەی نێوان باوك و کچ تێنەگەیشتن، تەنانەت حەزرەتی عائیشەی دایکیشمان کە لەو کۆڕەدا بوو، سەبارەت بەو بەسەرهاتە دەڵێت:

"تا ئێستا هیچ گریانێکم نەدیوە کەوا بە خێرایی ببێتە پێکەنین."

هێندەی پێنەچوو حەزرەتی عائیشەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) لە حەزرەتی فاتیمەی پرسی "لەپێشدا پێغەمبەری خوا چی فەرموو کە دەستت کرد بە گریان و لەپاشانیش چی پێ فەرموویت کە زەردەخەنە دایگرتیت؟"

بەڵام حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) نەیدەویست بەسەرهاتی گفتوگۆکەی نێوان خۆی و پێغەمبەری خوا باسبکات چونکە ئەوە نهێنییەکی نێوان خۆی و پێغەمبەری خوا بوو (درودی خوای لێبێت). لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) هەمووان ناچاربوون هەموو ئەو شتانەی دەیزانن دەربارەی پێغەمبەری خوا بەنهێنییەکانیشەوە بیگێڕنەوە لەپێناو ناساندنی پێغەمبەری خوا بە نەوەی نوێ، بۆیە حەزرەتی فاتیمەش ئەرکی سەرشانی لەم بوارەدا بەجێهێنا و ئەم یادگارییەی گێڕایەوە:

"کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) لە سەرەمەرگدا بوو بانگی کردمە لای خۆیەوە و هەواڵی کۆچی دوایی خۆیی پێدام، خۆم پێنەگیرا و دەستم کرد بە گریان بەڵام کاتێك بانگی کردمەوە لای خۆی و مژدەی ئەوەی پێدام من یەکەم کەس دەبم لە ئەهلی بەیت کە پێی شاد دەبمەوە دڵم خۆشبوو و زەردەخەنە گرتمی."

حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) زۆر

هۆگری پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لێبێت) بۆیە کۆچی دوایی سەروەرمان زۆر کاری تێکرد و زۆر دڵگرانبوو.

هەربۆیە لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) حەزرەتی فاتیمەی دایکمان بۆ چەندین ڕۆژ ئەسرین لە چاوانی وشك نەدەبوون و بەردەوام دەگریا. سەرکۆنەی ئەنەسی کوڕی مالیکی دەکرد کە چۆن دڵی هاتووە خۆڵ بداتەوە بەسەر ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەدا.

# حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا

لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) حەزرەتی فاتیمەی دایکمان بەمشێوەیە پێغەمبەری خوای دەلاواندەوە.

"ئەی ئەو باوکەی کە وەڵامی بانگهێشتەکەی خوای گەورەت دایەوە، باوکە گیان ئەی ئەو کەسەی نشینگەکەت یەکێکە لە باخچەکانی فیردەوس، باوکە گیان ئەی ئەو کەسەی کە هەواڵی گیانکێشانت بە حەزرەتی جوبرەئیلدا بۆ هات، ئەی باوکی بەسۆزم کە گەڕاویتەوە بارەگای خوای گەورە."

لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) خێزانەکەی ئەرکی بەڕێکردن و ناشتنی جەنازەکەیان لەئەستۆگرت و لەپاش تەواوبوونی مەراسیمی ناشتنی حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) مشتێك خۆڵی لەسەر گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا هەڵگرت و وتی:

"دەڵێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە بۆنی گڵی سەر گۆڕەکەت دەکات؟ بێگومان جارێکی تر نایەوێت بۆنی هیچ بۆنێکی خۆش بکات. بە جودایيت تووشی نەهامەتییەکی هێندە گەورە بووم ئەگەر نەهامەتی وا بەسەر ڕۆژدا نەهاتایە تاریک دادەهات و دەبوویە شەوەزەنگ."

# نەخۆشکەوتنی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان

بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوا خەریك بوو دەهاتە جێ. بە ماوەیەکی کەم لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) حەزرەتی فاتیمەی دایکمان نەخۆشکەوت و کەوتە سەر جێ و، کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی لەسەر دۆشەکەی مەرگ بەڕێ دەکرد، لەم کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر هات بۆ سەردانی و داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی بێتە ژوورەوە.

بۆیە حەزرەتی عەلی بە حەزرەتی فاتیمەی فەرموو "فاتیمە! حەزرەتی ئەبوبەکر داوای مۆڵەت دەکات بۆ هاتنە ژوورەوە."

حەزرەتی فاتیمەی دایکمان نموونەی ڕەوشت و وەفا بوو، بۆیە هەرگیز کەسێکی وەك حەزرەتی ئەبوبەکری نەدەگێڕایەوە دواوە کە خۆشەویستترین هاوڕێی بەوەفای پێغەمبەری خوا بوو.

پاش ئەوەی مۆڵەتی وەرگرت، حەزرەتی ئەبوبەکر

چووە خزمەت فاتیمەی دایکمان، سەلامی لێکرد و پێی فەرموو:

"فاتیمە! سوێند بە گەورەیی خوای گەورە هەرگیز مەرامم پارە و موڵك و سامان نەبووە، بەردەوام لەپێناو خوای گەورەدا هەوڵی بەدەستهێنانی شتانم داوە و هەر لەپێناو ئەویشدا بەخشیومە. بۆیە تاکە شتێك کە زۆر بەختەوەرم بکات ئەوەیە کە تۆ لێم ڕازی بیت.

لە وەڵامدا حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی "ئەی ئەبوبەکر! من لێت ڕازیم و گەردنت ئازاد بێت."

# بەشی ١١ یەمی

# حەزرەتی فاتیمەی دایکمان

حەزرەتی فاتیمەی دایکمان لەپاش جودایی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) تەنها شەش مانگ خۆی ڕاگرت. لەپاش کۆچی باوکی بەڕێزی ئیدی دنیا بۆ ئەو هیچ جیاوازی نەبوو لەگەڵ دۆزەخدا دوو مانگی کۆتایی ژیانی هەر لە جێدا بەسەر بردو نەیدەتوانی لە جێ هەستێتەوە. لەم کاتەدا کە پێویستی بە یەکێك بوو بۆ یارمەتیدان و چاودێری کردنی ئوم سەلمەی خێزانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا هات بە هانایەوە، بەردەوام لە خزمەتیدا بوو و لێی جیانەدەبوویەوە.

ئوم سەلمە کۆتا ساتەکانی ژیانی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە.

"لە کۆتا ڕۆژیدا کە بە نەستەم چاوی دەکردەوە، دەیزانی . مێندی نەماوە بگەڕێتەوە دیداری پەروەردگار، بۆیە

خۆشییەك دایگرت و وتی "پێم وایێت ئیتر هەڵناستمەوە." داوایکرد دەستنوێژێکی غوسڵی بۆ بگرم و منیش جێبەجێمکرد، لەپاشان فەرمووی "جارێکی تر جوان بمشۆن دەگەڕێمەوە خزمەتی باوکە بەڕێزەکەم"، ئەوەی وت و پاش کەمێك کۆچی دوایی".

وەسیەتی حەزرەتی فاتیمەی دایکمان بۆ ئەسپەردەکردنی ئەوە بوو کە بە هەمان شێوەی پێغەمبەری خوا بە شەو بنێژرێت بۆیە حەزرەتی عەلی و حەزرەتی عەباس و حەزرەتی فەزڵی کوڕی عەباس ڕۆشتنە نێو گۆڕەکە و ئەسپەردمیان کردە نێو خانە هەمیشەییەکەی.

خوای گەورە ئێمەش بەر شەفاعەتی ئەو کەسە پاك و پیرۆزە، ئامین.

# حەزرەتی

# فاتیمە

## ڕەزای خوای لێبێت

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا بوو، چپاندی بە گوێی حەزرەتی فاتیمەدا، حەزرەتی فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) دەستی کرد بە گریان. دووبارە کچەکەی بانگکردەوە لای خۆی و شتێکی تری چپاند بە گوێیدا، ئەوجا حەزرەتی فاتیمە ڕوخساری گەشایەوە و زەردەخەنەیەکی کرد.

لەپاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) حەزرەتی فاتیمە فەرمووی "کاتێك پێغەمبەری خوا لە سەرەمەرگدا بوو بانگی کردمە لای خۆیەوە و هەواڵی کۆچی دوایی خۆیی پێدام، خۆم پێنەگیرا و دەستم کرد بە گریان، بەڵام کاتێك بانگی کردمەوە لای خۆی و مژدەی ئەوەی پێدام من یەکەم کەس دەبم لە ئەهلی بەیت کە پێی شاد دەبمەوە، دڵم خۆشبوو و زەردەخەنە گرتمی."




نرخی ٣٠٠٠ دینارە

İRFAN PUBLISHING